# ناساندنی خاوەنی بیروباوەڕ



ناوی : أحمد كوڕی ئەمیر إسحاق كوڕی خەلیفە المتوكل كوڕی خەلیفە المقتدر كوڕی خەلیفە المعتضد كوڕی ئەمیر طلحة كوڕی خەلیفە المتوكل كوڕی خەلیفە المعتصم كوڕی خەلیفە هارون كوڕی خەلیفە أبي جعفر المنصور الهاشمي العباسي

كونیەكەی : أبو العباس

ناسراوە بە : القادر بالله

لەدایكبووی : ٣٣٦ هـ

وەفاتی : ٤٢٢ هـ رحمه الله

الذهبي لە السير (١٣٧/١٥) ئەڵێ: ٨٧ ساڵ كەم مانگێک و ١٨ ڕۆژ ژیا، وە وا نازانم هیچ خەلیفەیەكی ئەم ئوممەتە گەشتبێتە ئەم تەمەنە بگرە عثمان یش رضي الله عنه .

## ستایش کردنی:

لە کاتی خۆیدا سوننەتی زیندوو کردەوە و بڵاوی کردەوە، وە ئەهلی زەیغی کافر و ئەهلی بیدەع و ئەهواء ی دامرکاندەوە.

**ابن تیمیة** لە (مجموع الفتاوی ٢١/٤) ئەڵێ: لە ڕۆژانی دەسەڵاتی المتوکل دا ئیسلام بەعیززەت بوو تا وای لێهات ئەهلی زیممە پابەند کران بە مەرجەکانی عومەری - عمر بن الخطاب رضي الله عنه - ، وە بچوکەکانیش پابەند کران، سوننەت و جەماعەت بەعیززەت بوون، جەهمی و ڕافیضە و نمونەکانیان زەلیل بوون، وە بەهەمان شێوە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی المعتضد و المهدي و القادر و جگە لەوانیش، ئیسلام لەسەردەمیاندا بەعیززەت بوو، وە سوننەتیش بەهێندەی ئەوە.

**الخطیب** ئەڵێ: دینداری و بەردەوام تێکۆشان و زۆری صەدەقات کردن بەناوبانگن لێوەی، وە کتێبێکی دانا لە بنچینەکانی دین تیایا باسی فەزڵی هاوەڵان و بەکافردانانی ئەو کەسەی کردووە کە بڵێت قورئان مەخلوقە، وە ئەو کتێبە هەموو جومعەیەک لە مەجلیسی هاوەڵانی حەدیث ئەخوێندرا، لەماوەی خەلافەتەکەی خەڵکی ئامادەی ئەبوون، وە ئەوەش ٤١ساڵ و ٣ مانگ بوو.

**ابن کثیر** لە (البدایة والنهایة ٢٦/١٢) دەربارەی ڕووداوەکانی ساڵی ٤٢٠ ھ ئەڵێ: خۆی دوورگرت لە بانگخوازە شیعیەکان، وە بوو بە دۆستی بانگخوازە

سوننیەکان، سوپاس و منەت بۆ الله لەسەر ئەمە و جگە ئەمەش، فیتنەیەک ڕوویدا لە مزگەوتی براثا وە بە بەرد دایان لە بانگخوازێکی سوننی تا لوتیان شکاند و شانیان داگرت، خەلیفە سەری خست بەسەریانا و سوکایەتی بە شیعەکان کرد و زەلیلی کردن تا وای لێهات هاتن بیانوویان هێنایەوە لەوەی کردوویانە، وە ئەمەش لەلایەن گەمژەکانیانەوە ئەنجام دراوە.

## پوختەی بیروباوەڕ:

ابن تیمیة لە (درء التعارض ٢٥٢/٦) ئەڵێ: شێخ أبو أحمد الکرجي پێشەوای ناسراو لە چوارسەدەکاندا لە بیروباوەڕدا لەوەی باسی کردووە لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە، ئەوە ئەو بیروباوەڕە بوو کە بۆ خەلیفە القادر باللهی نووسی، وە بەسەر خەڵکیدا خوێندیەوە، وە خەڵکی لەسەر کۆکردەوە، وە ئەهلی سوننە دانیان پیانا، وە داوای تەوبەی لەوانە کرد کە دەرچووبوون لە سوننەت لە موعتەزیلە و ڕافیضە و نمونەکانیان لە ساڵی ٤١٣ هـ.

## سەرچاوەی بیروباوەڕ:

ئەم بیروباوەڕە لە کتێبی (المنتظم) ی ابن الجوزي دەرهێندراوە، وە بەتەواوی ئەم بیروباوەڕە هاتووە بە سەنەدەوە.

ابن الجوزي لە کتێبی (المنتظم) ئەڵێ: محمد بن ناصری حافظ هەواڵی پێداین، أبو الحسین محمد بن محمد بن الفراء بۆی گێڕاینەوە و وتی: پێشەوا القائم بأمر الله پێشەوای ئیمانداران أبو جعفر ابن القادر بالله بە (بیروباوەڕی القادري) کە القادر باسی کردووە دەرچوو، خوێندرایەوە لە دیوان، وە زاهید و زاناکانیش ئامادە بوون، وە لەوانەی ئامادە بوون شێخ أبو الحسن علي بن عمر القزویني - ئەمە الدارقطني نیە رحمە الله، زانایەکی ترە کە ئەویش زاهید و سونی بووە رحمە الله - ، بە خەتی خۆی لەژێریەوە لێی نووسی پێش ئەوەی فەقیهەکان لێی بنووسن، فەقیهەکانیش بە خەتی خۆیان لێیان نووسی.

ئەمە بیروباوەڕی موسڵمانانە، هەرکەس پێچەوانەی بکات بەڕاستی فاسق بووە و کافر بووە، ئەویش:

١ - پێویستە لەسەر ئینسان کە بزانێت الله تاکە و هاوبەشی نیە، نە کەسی لێ بووە و نە لە کەسیش بووە، وە هیچ هاوتا و هاوشانێکیشی نیە، کەسی نەگرتووە بە خێزان و منداڵی خۆی، وە هیچ هاوبەشێکیشی نیە لە موڵکدا.

___

: غولاتی صۆفیە ئەشعەریەکان بڕوایان وایە کە ٤ قوطبەکە: الدوسقي و عبدالقادر و البدوي و الرفاعي ئەتوانن تەصەڕوفات بکەن لە کەوندا .

**٢** - وە ئەو یەکەمە و کەس پێش ئەو نەبووە، وە کۆتایە و کەس دوای ئەو نامێنێت، بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکەوە، بێ دەسەڵات نیە بەرامبەر هیچ شتێک، کاتێک بیەوێت شتێک ببێت پێی ئەفەرمووێ: | **كُن** |، ئەویش ئەبێت.

---

: دروستکردن و فەرمان جیایە | **أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ** | [**الأعراف : ٥٤**] بە فەرمانی الله | **كُن** | هەموو شتێک بووە و ئەبێت .

**٣** - دەوڵەمەندە و بێ نیازە لە هەر شتێک، هیچ خوایەک شایەنی پەرستن نیە بە حەق جگە لە ئەو زیندوو و ڕاگرە، خەو و خەوەنوچکە نایگرێتەوە، نان ئەدات و نانی نادرێتێ، هەست بەتەنیایی ناکات و ویستی لە هیچ کەسێک نیە، وە ئەو دەوڵەمەندە لە هەموو شتێک، کات و سەردەم دوای ناخەن، چۆن کات و سەردەم بیگۆڕن لەکاتێکدا خۆی دروستکەری کات و سەردەم و شەو و ڕۆژ و ڕوناکی و تاریکی و ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی تیایدان لە جۆرەها دروستکراو و وشکانی و دەریا و ئەوەشی تیایدان و هەموو شتێکی زیندوو و مردوو و بێ گیان ە.

**٤** - پەروەردگارمان تەنهایە هیچ شتێکی لەگەڵدا نیە، وە هیچ شوێنێک چواردەوری نەداوە، هەموو شتێکی بە قودرەتی خۆی درووست کردووە، وە عەرشی درووست کردووە نەک بۆ ئەوەی پێویستی پێی بێ، بەرز بۆتەوە بۆ سەری بەو شێوەیەی خۆی ئەیەوێ، بۆ پشوودان نا وەک درووستکراوەکان کە پشوو ئەدەن.

---

: کە ئەڵێت پێویستی بە عەرش نیە و پشوو نادات لەسەری مەبەستی ئەوەیە الله تعالى عەرشی درووست نەکردووە بۆ ئەوەی پشوو بدات لەسەری چونکە الله تعالى هیلاک نابێت بەڵکو ئەوە درووستکراوەکانن کە هیلاک ئەبن و دائەنیشن بۆ پشوودان، الله تعالى ئەفەرموێ:
| **وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ** | (ق : ٣٨) .

**٥** - وە ئەوە هەڵسورێنەری ئاسمانەکان و زەویەکان، وە هەڵسورێنەی هەرچ شتێکە تیایاندا وە لەوەی لە وشکانی و دەریادایە، هەڵسورێنەر و پارێزەر نیە جگە لە ئەو، ڕزقیان ئەدات و نەخۆشیان ئەخات و چاکیان ئەکاتەوە، ئەیانمرێنێت و ئەیانژێنێت، درووستکراوەکان هەموویان بێ دەسەڵاتن؛ فریشتەکان، پێغەمبەران، نێردراوان، وە هەموو درووستکراوەکان.

---

: غولاتی صۆفیە ئەشعەریەکان پێیان وایە رسول الله ﷺ یان قوطبێک یان مەرقەدێک لەگەڵ الله تعالى دەسەڵاتی ئەو شتانەیان هەیە .

٦ - وە ئەو بەدەسەڵاتە بە قودرەتەکەی کە هەیەتی، وە زانایە بە عیلمێکی ئەزەلی.

٧ - وە ئەو بیسەرە بە بیستنەکەی، وە بینەرە بە بینینەکەی، ئەو دوو صیفەتە لە نەفسی خۆیەوە ئەزانێت، هیچ یەکێک لە درووستکراوەکانی بوونەکەی پێ ناگەیەنن.

---

: واتە الله تعالى زاتی خۆی صیفەتی بینین و بیستنی هەیە نەک ئەوەی درووستکراوێک شتەکانی پێ بگەیەنێت، هەرکەس وا بڵێت ئەوە پێی وایە الله تعالى کەڕ و کوێرە، إبراهیم یش علیه السلام بەوە بتەکانی قەومەکەی عەیبدار ئەکرد کە هیچ نابینن و هیچ نابیستن | إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا | [مريم : ٤٢] .

ئەمەش ڕەددە بۆ ئەشعەریە جەهمیە کافرەکان کە دەڵێن بیستی الله واتە الله شتێک دروست ئەکات کە قسەکان ببیستێت، وە قسەکردنی الله واتە الله شتێک دروست ئەکات کە ئەوەی ئەیەوێت لەڕێگەی ئەو دروستکراوەکەوە بیلێت والعیاذ بالله، الله تعالى ڕووڕەشی دنیا و قیامەتیان بکات وەک چۆن کردوونی، وە نووسەر لێرەدا بیستن و بینینێکی حەقیقی بۆ الله عز وجل جێگیر دەکات .

٨ - قسەکەرە بە کەلام نەک بە هۆکارێک کە مەخلوق بێت وەک هۆکاری درووستکراوەکانی .

---

: نووسەر لێرەدا قسەکردنێکی حەقیقی بۆ الله عز وجل جێگیر ئەکات، ئەو کەسانەی ئەڵێن الله تعالى بە زاتی خۆی قسەی لەگەڵ موسا عليه السلام نەکردووە بەڵکو کەلامەکەی خەلق کرد لە دارەکە یان لە نزیک چیاکە، ئەوە پێیان وایە شتێکی تریش جگە لە الله تعالى بانگەشەی خوایەتی کردووە، چونکە بەرامبەر موسا عليه السلام ئەفەرموێ: | إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ | [طه : ١٤]

٩ - وەصف ناکرێ ئیللا بەوەی خۆی وەصفی پێ کردووە، یان پێغەمبەرەکەی وەصفی پێ کردووە، وە هەموو صیفەتێک خۆی وەصفی کردبێت، یان نێردراوەکەی وەصفی کردبێت ئەوە صیفەتێکی حەقیقیە مەجازی نیە.

---

: ئەمە ڕەددی تیایە بۆ ئەشعەری و ماتوریدیە جەهمیە کافرە زەندیقەکان کە کوفری کەلام سەری خواردوون و هەموو شتێک بەو عیلمە بۆگەن و گڵاوە ئەپێون، چونکە قورئان و فەرموودە لەگەڵ کوفری کەلام ناگونجێت، ئیتر ئەو زەندیقانە دێن ئەڵێن ڕووکەشی قورئان و سوننەت مەبەست نییە، پاشان تەحریفی ئەکەن بە کوفری کەلام .

١٠ - وە بزانرێت کەلامی الله تعالی غەیر مەخلوقە، بە قسەکردن قسەی پێکردووە، وە دایبەزاندووە بۆ سەر نێردراوەکەی لەسەر زمانی جبریل علیه السلام دوای ئەوەی جبریل علیه السلام لێوەی بیست، جبریل علیه السلام خوێندیەوە بەسەر محمد ﷺ، وە محمد یش خوێندیەوە بەسەر هاوەڵەکانیدا، وە هاوەڵەکانیشی رضي الله عنهم خوێندیانەوە بەسەر ئوممەتدا، بەو خوێندنەوەی ئەو درووستکراوانە نەبوو بە مەخلوق، لەبەر ئەوەی ئەوە ئەو کەلامەیە کە الله قسەی پێ کردووە کە ئەویش غەیر مەخلوقە لەهەموو حاڵەتێکدا، بە خوێندراوەیی و حیفظکراوەیی و نوسراوەیی و بیستراوەیی، وە هەرکەس بڵێ : ئەوە مەخلوقە لە هەر حاڵەتێک لەو حاڵەتانە ئەوە کافرە، خوێنی حەڵاڵە دوای داوای تەوبەلێکردنی.

: ئەمەش ڕەددی تیایە بۆ لەفظیە جەهمیەکان کە لە کۆن و تازەدا ئەشعەریەکان هاوهەڵوێست بوون لەگەڵیان و وەک مونافیق هەمیشە بیروباوەڕی خۆیان دەربارەی قورئان شاردووەتەوە .

١١ - وە بزانرێت ئیمان وتە و کردار و نیەتە، وتەیە بە زمان، وە کردارە بە ئەندامەکانی لەش، وە بەڕاستخستنەوەیەتی، زیاد ئەکات و کەم ئەکات، زیاد ئەکات بە گوێڕایەڵی، کەم ئەکات بە سەرپێچی.

**١٢** - وە ئەویش بەش بەش و پۆل پۆلە: بەرزترین بەشی: لا إله إلا الله یە، وە نزمترینی لابردنی نارەحەتییەکە لەسەر ڕێگا، وە شەرم پۆلێکە لە پۆلەکانی ئیمان .

---

: عومیە خەواریجەکان هیچ سەنگێکیان بۆ وشەی لا إله إلا الله نەهێشتووەتەوە بەبیانووی ئەوەی ئەبێت بزانرێت ئەو کەسە لە ناخی دڵیەوە ئەیڵێت ئینجا لێی قبوڵ ئەکرێت لەکاتێکدا نەصرانیەک یان یەهودیەک تەنها بە وتنی وشەی لا إله إلا الله ئەبێت بە موسڵمان و خوێنی حەرام ئەبێت دواتر ناچار ئەکرێت فەرزەکانیش ئەنجام بدات، وە ڕەددی تیایە بۆ مەدخەلیە جەهمیەکان چونکە نابێت لە ڕووکەشدا ئەو لا إله إلا الله یە هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەکی هەبێت ئەگینا وتنی هیچ سوودی نابێت بۆ خاوەنەکەی .

**١٣** - وە صەبر لە ئیمانەوەیە وە وەکو سەر وایە لە جەستەدا.

**١٤** - وە ئینسان نازانێت ئەو چۆن نوسراوە لای الله، وە بەچی کۆتایی پێ دێت، وە بۆیە ئەڵێت :

**أ** - ئیماندارم إن شاء الله .

**ب** - هیوادارم ئیماندار بم .

ئەم استثناء و ئومێدە هیچ زەرەری لێ نادات، وە بەوانە نابێتە کەسێکی گومانکەر، لەبەرئەوەی مەبەستی لەوە ئەوەیە حاڵی قیامەت و خاتیمەکەی لێ نادیارە.

: وتەی (ئینسان نازانێت ئەو چۆن نوسراوە لای الله) واتە نازانێت بە کافر نووسراوە یان موسوڵمان .

وە ماتوریدیەکان ئەشعەریەکان بە کافر ئەزانن لەبەرئەوەی ئەڵێن ئیمانداریـن إن شاء الله، کەچی زەندیقەکان ئەڵێن ئەشعەری و ماتوریدی پێکەوە ئەهلی سوننەن لەکاتێکدا ئەوان یەکتریان پێ کافر و مبتدع ە لە نزیکەی ١٥ بابەتدا .

١٥ - وە هەموو شتێک کە نزیکی ئەکاتەوە لە الله تعالی وە ئەنجامی ئەدات تەنها لەپێناو ئەودا لە جۆرەکانی گوێڕایەڵی: فەرزەکانی، وە سوننەتەکانی، وە فەضائیلەکانی، ئەوە هەمووی لەو ئیمانەوەیە کە ئەدرێتە پاڵی.

١٦ - هیچ کۆتاییەک بۆ ئیمان نیە، چونکە فەضائیلەکان کۆتاییان نیە، وە بۆ کەسی شوێنکەوتوو لە فەرزەکاندا کۆتایی نیە.

: مەبەستی ئەوەیە ئیمان کامڵ نابێت لەبەر ئەوەی کارە باشەکان زۆر زۆرن تۆش ناتوانیت هەموویان ئەنجام بدەیت، وە ناتوانیت لە فەرزەکاندا وەک رسول الله بیت کە شوێنی کەوتووی، بۆیە ئیمان کۆتایی نیە، والله تعالى أعلم .

**١٧** - وە پێویستە کە هەر هاوەڵێک لە هاوەڵانی رسول الله ـت خۆش بوێت، وە بزانین کە ئەوانە باشترین درووستکراون دوای رسول الله.

---

: باشترین کەسەکانی سەر زەوی دوای رسول الله و پێغەمبەرەکان علیهم الصلوات هاوەڵە بەڕێزەکانن رضي الله عنهم جميعا .

**١٨** - وە باشترین و خاوەنی زۆرترین فەزڵیان دوای رسول الله: أبو بكر الصديق ـه، دواتر عمر بن الخطاب ـه، دواتر عثمان بن عفان ـه، دواتر علي بن أبي طالب ـه رضي الله عنهم.

**١٩** - وە شاهێدی بەهەشت بۆ **١٠** مژدە پێدراوەکە بدەیت.

**٢٠** - وە ڕەحمەت بنێریت بۆ خێزانەکانی رسول الله رضي الله عنهن.

**٢١** - وە هەرکەس جوێن بدات بە عائشة رضي الله عنهما ئەوا هیچ بەشێکی لە ئیسلام نیە.

---

**٧٦٤** - أبو بكر المروذي ئەڵێت: پرسیارم کرد لە أبو عبدالله دەربارەی ئەوەی جوێن ئەدات بە أبا بكر و عمر و عائشة؟

وتی: (واینابینم لەسەر ئیسلام بێت).

مالک ئەڵێت: (ئەوەی جوێن بدات بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هیچ بەشێکی نییە لە ئیسلامدا) **السنة للخلال**.

**٢٢** - وە هیچ مەڵێ دەربارەی معاوية رضي الله عنه ئیللا بە خێر و باشە.

---

: خاڵی **٢١** و **٢٢** ڕەددە بۆ ڕافیضی و مەشرەب ڕافیضیەکان.

**٢٣** - وە مەچۆ ناو شتێکەوە کە ڕوویداوە لە نێوانیاندا، وە ڕەحمەت بنێرە بۆ کۆمەڵەکانیان، الله تعالى ئەفەرموێ: | **وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ** | [**الحشر**: ١٠].

وە دەربارەیان ئەفەرموێ: | **وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ** | [**الحجر**: ٤٧].

٧٥٣ - ئیمام أحمد وتی : (لەسنووردەرچوون لە هاوەڵانی محمد ﷺ دا واتە لەسنووردەرچوون لە باسکردنی رسول الله ﷺ، چونکە رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (الله الله لە هاوەڵەکانم، مەیانکەن بە جێی ئامانج و مەبەست) .

وە فەرموویەتی : (ئەوان وەکو ئەستێرە وان، شوێنی هەرکامێکیان بکەون هیدایەتدراون).

پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە لە باسکردنی هاوەڵانی، وە لەوەی کەسێک تانەیان لێبدات، وە رسول الله ﷺ هەواڵی پێدراوە و ئەزانێت کە دوای خۆی لەناو هاوەڵانیدا چی ڕووئەدات، جا شوێنپێی رسول الله ﷺ هەڵئەگیرێت، وە دەم ئەگیردرێتەوە لەوەی لە نێوانیان ڕوویداوە، وە ڕەحمەت ئەنێردرێت بۆ هەموویان، وە ئەوەیان پێش ئەخەین کە رسول الله ﷺ پێشی خستووە، وە ڕازی ئەبین بەوەی رسول الله ﷺ لە ژیان و پاش مردینیشی لێی ڕازی بووە، الله ئەفەرموویت : | تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ | (البَقَرَة : ١٣٤)
.

وە رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (باشترینی خەڵکی، خەڵکی ئەم سەردەمەن منی تێدا نێردراوە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ... پاشان) .

وە ئەفەرموویت : (ئەگەر یەکێک لە ئێوە پڕ بە زەوی زێڕ بکات بە خێر ناگات بە مشتێکی یان نیوەی مشتی ئەوان) .

پێگەی بەرز و فەزڵ بۆ ئەوانە، وە واز بێنە لەوەی کە ڕوویداوە لە نێوانیان، علي رحمە الله ئەفەرموویت : هیوام وایە من و عثمان لەوانە بین کە الله دەربارەیان ئەفەرموویت : | وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ | (الحِجْر : ٤٧) .

وه علي ئەمە بە خۆی و طلحة و الزبير يش ئەڵێت و ڕەحمەت بۆ هەموویان ئەنێرێت، وە ئێمەش باسیان ناکەین تەنها بەوە نەبێت کە الله فەرمانی پێ کردووین : ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ (الحَشْر : ١٠) .

ئەمە ڕێگای ڕۆشن و ڕێباز و مەنهەجی ڕێکە بۆ هەر کەسێک الله خێری بۆی بوویت و تێگەیاندبێت، الله ئێمە و ئێوەش بە ڕەحمەتی خۆی بپارێزێت لە هەموو لەناوچوونێک .

وە ئەڵێت : هەر کەسێک هاوەڵانی محمد ﷺ پارێزراو بن لێی هیوام وایە پارێزراو بێت .

وە ئەڵێت : لە پاش پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسێک نییە منەتی بەسەر ئیسلامەوە زیاتر بێت لە أبو بكر رحمه الله لەبەر شەڕکردنی لەگەڵ ئەهلی ڕیددە و جێگیرکردنی ئیسلام، پاشان عمر بن الخطاب رحمه الله، ڕەحمەت لە هاوەڵانی پێغەمبەر بێت، وە الله سوودمان پێبگەیەنێت بە خۆشویستنیان) **السنة للخلال** .

**٢٤** - وە کەس کافر مەکە بە تەرک کردنی هیچ شتێک لە فەڕزەکان جگە لە نوێژی فەڕزێک، لەبەر ئەوەی هەرکەس وازی لێ بهێنێت بەبێ بیانوو وە دەستی بەتاڵ بێ تا کاتەکەی نامێنێت، ئەوە کافرە، ئەگەرچی نکۆڵیشی لێ نەکات - نکۆڵی واجب بوونی نوێژ - ، لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (نێوانی بەندە و کوفر وازهێنانە لە نوێژ، هەرکەس وازی لێ بهێنێت کافر بووە)، کافرە تا ئەو کاتەی تەوبە ئەکات و ئەیگێڕێتەوە، ئەگەر مرد پێش ئەوەی تەوبە بکات و بیگێڕێتەوە، یان زۆری کرد کە نەیگێڕێتەوە: نوێژی لەسەر ناکرێت، وە حەشر ئەکرێت لەگەڵ فیرعەون و هامان و قارون و أبي بن خلف.

: کەسێک نوێژێک تەرک ئەکات بە ئەنقەست تا کاتەکەی نامێنێت و دوایی تەوبە ئەکات ئایا پێویستە نوێژەکە بگێڕێتەوە یان نا؟! ئەم بابەتە خیلافی لەسەرە لەنێوان زانایانی سەلەف رحمهم الله .

## ٢٥ - تەکفیر ناکرێت بە وازهێنان لە کردارەکانی تر، فاسق ئەکرێت تا ئەوکاتەی نکۆڵی لێ ئەکات.

: بۆ نمونە ئەم ئەگەر خەلیفەیە رحمه الله کە موسڵمانە حوکم بە قورئان نەکات بەڵام باوەڕی بە حوکمەکە هەبێت وەک ئەوەی دەستی دز نابڕێت بەڵکو سجنی ئەکات ئەمە پێی فاسق ئەبێت، بەڵام ئەگەر بێتو نکۆڵی لە حوکمەکە بکات ئەوکات کافر ئەبێت، بەڵام خەواریجەکان پێیان وایە ئەم خەلیفەیە ئەگەر لەجیاتی ئەوەی دەستی دز ببڕێت سجنی بکات ئەوە کافرە و طاغوتە با تەوحیدیشی هەبێت .

دواتر وتی: ئەمە وتەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە هەرکەس دەستی پێوە بگرێت لەسەر حەقێکی ڕوونە، وە لەسەر مەنهەجی دین و ڕێگای ڕوونە، وە ئومێد وایە پێی ڕزگار ببێت لە ئاگر، وە بچێتە بەهەشت إن شاء الله.

**٢٦** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دین دڵسۆزیە) .

وترا: بۆ کێ ئەی رسول الله؟

فەرمووی: (بۆ الله، وە بۆ کیتابەکەی، وە بۆ نێردراوەکەی، وە بۆ پێشەواکانی موسڵمانان، وە بۆ گشتیان).

**٢٧** - وە ئەفەرموێ: (هەر بەندەیەک ئامۆژگاریەکی بۆ بێت لە الله وە لە دینەکەیدا ئەوە نیعمەتێکە لە الله وە بۆی نێردراوە، یان قبوڵی ئەکات بە شوکرانەبژێریەوە یان ئیللا بەڵگەیەکە لەسەری لەلایەن الله وە تا تاوانەکانی پێ زیاد بکات، وە بەوە تورەیی الله زیاد بکات).

الله بمانکات بە شوکرانەبژێران، وە بۆ نیعمەتەکانی بمانکات بە یادگەر، وە بە سوننەتەوە دەست گیرۆمان بکات، وە لە ئێمە و تەواوی موسڵمانان خۆش بێت.

عەقیدەکە بە عەرە بی :

https://t.me/jami3mutun/59